وتاری بیست و سێ

زنجیرە وتاری (شیرک و شیرکی گوێڕایەڵیکردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## ئەنـدامانی پەرلەمان لە قــورئانی پیرۆز

## أعضـاء الــبرلمان في القــرآن الكــريم

شێخی موجاهید

تقبله الله

أبو علي الأنباري

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

پێگەی ڕاستەڕێ




پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (بیست و سێ)

بەناونیشانی
ئەندامانی پەرلەمان لە قورئانی پیرۆز
اعضاء البرلمان في كتاب الله تعالى

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:

لە فەزڵ و بەخششی الله تعالی تەواوبووین لە نۆ جێگەکە کە هەموو حیزبێکی بەشداربوو لەو حکومەتە تاغوتییانە دەچێتە ناویانەوە کە ئەندامیان هەیە لە دەسەڵاتی تەشریعی یاخود لە ئەنجومەنی تەشریعی یاخود ئەوەی ناسراوە بە پەرلەمان، لایەنێکی تر لە لایەنەکانی پەرلەمان و هەندێك لە وردەکاری پەیوەست بەم پێکهاتەیە تاوتوێ دەکەین، وە تاوتوێکردنەکەمان بە ئیزنی الله عز وجل لەبارەی پێگەی ئەوانە لە پەڕتوکی الله عز وجل دەبێت، ئەندامانی پەرلەمان ئەوانە حاڵیان چۆنە لە پەڕتوکی الله تعالی؛ ئایا ئایەتانێك هەیە باسی حاڵی ئەو کەسانە بکات، وە چۆن الله تعالی وەسفی کردوون و حوکمیشیان چییە؟

جا پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم: لە پەڕتوکی الله تعالی ئاماژە دراوە بە نموونەی ئەوانە لە سێ جێگەدا، جێگەی یەکەم ئەم فەرموودەیەی الله تعالی ــیە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ١٠٠ وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٠١﴾[١] ، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر گوێڕایەڵی هەندێك لەوانە ببن کە کتێبی (ئاسمانییان) پێدراوە، دوای ئەوەی کە ئێوە باوەڕتان هێناوە، دەتانگێڕنەوە سەر ڕێبازی کوفر و بێباوەڕی * جا ئێوە چۆن کافر دەبن لە کاتێکدا کە ئایەتەکانی الله ــتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە و پێغەمبەرەکەی لەناوتاندایە، جا ئەوەی پشت بە الله ببەستێت و پەیڕەوی لە بەرنامەکەی بکات، ئەوە بەڕاستی بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست هیدایەت دراوە. ئەمە ئایەتی یەکەم، ئایەتی

(١) آل عمران: ١٠٠ - ١٠١.

دووەمیش ئەم فەرموودەیەی الله تعالى ـيە لە سورەتی -النساء- ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾﴾[1] ، واتە: بەڕاستی (الله تعالى) لە قورئاندا ئەم فەرمانەی ناردووە بۆ سەرتان کە: هەر کاتێك لە جێیەکدا گوێتان لێ بوو کوفر و گاڵتە بە ئایەتەکانی الله دەکرا، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا هەتا قسە و باسەکەیان بگۆڕن (ئەگەر دانیشن و پشتگوێی بخەن) ئەوە بەڕاستی ئێوەش لەو کاتەدا وەك ئەوانن و (حسابی ئەوانتان بۆ دەکرێت) بەڕاستی الله دووڕووەکان و بێ باوەڕەکان هەموویان لە دۆزەخدا کۆدەکاتەوە. ئەم ئایەتە پەیوەندی هەیە بە ئایەتێکی تر: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنْسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَى الَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ﴾[2] ، ئایەتی سێیەم یاخود جێگەی سێیەم لەم فەرموودەیەی الله تعالى ـيە ﴿إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾﴾[3] ، واتە: بەڕاستی ئەوانەی پاشگەز بوونەوە و بەرەودوا گەڕانەوە، دوای ئەوەی ڕێگەی هیدایەت و ئیمانیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەوانە شەیتان بە فێڵ و تەڵەکە تەماداری کردبوون، بەهیوای تەمەن درێژی و خۆشگوزەرانیش فریوی دابوون * ئەو زاڵ بوونی شەیتانە بەهۆی ئەوەوە بوو کە دەیانوت بەوانەی کە داخ لەدڵ بوون بەرامبەر ئەوەی الله دایبەزاندووە کە قورئانە: ئێمە لەمەودوا لە هەندێك هەڵوێستدا بە قسەتان دەکەین، خوایش خۆی چاك ئاگادارە لەو نهێنی و پیلانانەی کە دەیشارنەوە.

ئایەتی یەکەم کە لای دەوەستین فەرموودەی الله تعالى ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا فَرِيقًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنْتُمْ تُتْلَى عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُ وَمَنْ يَعْتَصِمْ بِاللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ ، پەیوەندی ئەم ئایەتە چییە بە حکومەتەکان و پەرلەمانەکان و ئەم جۆرە شتانە؟ کاتێك دەگەڕێی لەو وردەکاری و لایەنە تایبەتییەی باسکراوە لەم ئایەتەدا؛ ئایا هاتوەتە دی لە واقیعی ئێمە؟ وە بەر لە قسەکردن لەبارەی واقیعەکەمان ئاماژە دەکەم بە هەندێك بابەتی پەیوەست بە ئایەتەکە، بابەتی یەکەم: هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە هەروەك زانایانی تەفسیر -ڕەحمەتی فراوانی الله تعالى لەسەریان بێت- باسیان کردووە دەڵێن: پیاوێك لە جوولەکە لە مەدینە؛ مەدینەی رسول الله ﷺ بە

(١) النساء: ١٤٠.

(٢) الأنعام:٦٨-٦٩.

(٣) محمد: ٢٥ - ٢٦ .

لای کەسانێك لە ئەوس و خەزرەج تێپەڕی کە تەبا بوون و یەکتریان خۆشدەویست، وە دانیشتبوون قسەیان دەکرد لەگەڵ یەکتر جا جوولەکەکەش لەم کارە تووڕە بوو هەروەك لە لای "الواحدي" (رحمه الله) هاتووە لە (أسباب النزول) دەڵێت: ئەو کابرایە کە ناوی "شاس بن قيس" بوو -جوولەکە بوو- وتی: ئەوانە ئەگەر کۆببنەوە ئیتر بوونمان نامێنێت لە مەدینە ئینجا لەو تەباییە تووڕە بوو و ئەم کۆبوونەوەیەش لەوانەیە ببێتە هۆی دەرکردنیان لە مەدینە، جا یەکێك لە گەنجەکانی جوولەکەی نارد و وتی بڕۆ بۆ لایان و شیعرەکانیان بیربخەرەوە لە ڕۆژی (بُعاث)؛ ڕۆژی (بُعاث) تیایدا دوایین جەنگ ڕوویدا لە نێوان ئەوس و خەزرەج پێش گەیشتنی رسول الله (ﷺ)بۆ مەدینە، وە زۆرێك کوژران لە ئەوس و زۆرێکی تریش لە خەزرەج کوژران، جا ئەم جوولەکەیە هات و لە لایان دانیشت و ئینجا دەستی کرد بەوەی شیعرەکانیان بیر بخاتەوە؛ چۆن فڵان دەیوت فڵانم کوشت و چۆن فڵان ئاوای دەوت.. جا دەروونەکان وروژان لەو هاوەڵە چاکانە و بە خێرایی چوون بۆ چەك هەڵگرتن و ویستیان دەست بکەنەوە بە جەنگ هەروەك ئەوەی لە جاهیلیەت هەبوو، وە باسەکە گەیشتە لای رسول الله (ﷺ)ئینجا هات بۆ لایان و فەرمووی: ئایا بانگەشەی جاهیلیەت نوێ دەکەنەوە لە کاتێکدا من لەناوتانم؟! -لە جاهیلیەتدا ئێوە بەم شێوەیە بوون بەڵام ئێستا من لەناوتانم و دەتانەوێت ئەوە بکەن کە پێشتر دەتانکرد لە جاهیلیەت-، جا الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ١٠٠ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ﴾ ئەمە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە بوو، ئەوەی باسکراوە لەم ئایەتەدا ئایا کوفری دەرچوێنەرە لە دین یان کوفری بچووکە؟ الله تعالى زاناترە، جەنگ هەڵگیرسان لە نێوان ئیمانداران خودی جەنگکردنەکە دەرچوێنەر نیە لە دین، واتە دەشێت ئیمانداران بجەنگن لە نێوان خۆیان لەبەر دین یان لەبەر دونیا، لەبەر دین بۆ نموونە: هەندێك لە خەڵکی دەردەچن لە دەسەڵاتداری مسوڵمان جا ئەم دەسەڵاتدارەش دەجەنگێت لەگەڵیان، ئەمە جەنگێکە بەهۆی دینەوە بەڵام هەردوو لایەنەکە ئیماندارن، وە دەشێت بەهۆی هەندێك ناکۆکییەوە بێت لەسەر کاروباری دونیا ئەمەش بە هەمان شێوە لەوانەیە ڕووبدات لە نێوان ئیمانداران، بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله تعالى ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓاْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ٩﴾[1] ، واتە: ئەگەر دوو دەستە، یان دوو تاقم لە مسوڵمانان بوو بە شەڕیان، ئەوە دەستبەجێ هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە، خۆ ئەگەر لایەکیان هەر دەستدرێژی دەکردە سەر لاکەی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن کە

(١) الحجرات: ٩.

ستەم و دەستدرێژی دەکات، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی الله ... جا گەر لایەنە سەرکەشەکە بۆ فەرمانی الله سەری دانەواند، ئەوە ئێوە ناوبژیوانێکی دادگەرانە لە نێوانیاندا بکەن و دادپەروەری ئەنجام بدەن، چونکە بەڕاستی الله ئەوانەی خۆش دەوێت کە دادپەروەری ئەنجام دەدەن.

کەواتە دەکرێت جەنگ ڕووبدات لە نێوان دوو دەستەی ئیماندار، [قوتابیەك پرسیار دەكات: شێخ واتە ئەمە لەگەڵ حەلاڵکردنی خوێن یان بەبێ حەلاڵکردنی خوێن] ئەویش دەڵێت: نەخێر بەبێ حەلاڵکردنی خوێن، ئەمە لە پێناو دونیا بۆ نموونە دەستدرێژیکارن و دەجەنگن لەگەڵیان جا هەردوولا ئیماندارن، بەڵام ئەوەی ڕوویدا لە نێوان هەندێك تاك لە ئەوس و خەزرەج بە جوڵاندنێك بوو لە لایەن جوولەکەوە، بۆچی الله عز وجل فەرمووی (يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ۝١٠٠ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ) ؟ سەرەتا؛ چونکە ئەم شەڕە کە خەریك بوو ڕووبدات لە پێناو دین یان دونیا نەبوو بەڵکو گوێڕایەڵیکردنی هاندانێك بوو لە جووێکەوە، هەندێك لە جوولەکە بوون ئەوانیان جووڵاند جا بەدەم هاندانەکەی جوولەکەوە هاتن و خەریك بوو بجەنگن

شتێکی تر: ئەوان کاتێك ویستیان بجەنگن، ویستیان بجەنگن هەروەك ئەوەی هەبوو لە جاهیلیەت واتە یەکێکیان خوێنی ئەوی تری حەڵاڵ دەکرد جا دەروازەکە لێرەدایە ئەگینا الله عز وجل دەربارەی ئەوس و خەزرەج فەرمووی ﴿وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا... ﴾[١] ، واتە: هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی الله وە بگرن و پەرت و بڵاو مەبن، یادی ناز ونیعمەتی الله بکەنەوە لەسەرتان، (چونکە) کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوە بوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست کرد بەیەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر. ئێوە لە جاهیلیەتدا دوژمنی یەکتر بوون و دەجەنگان، هەروەها لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستا بوون بەڵام الله تعالى لەو ئاگرە ڕزگاری کردن، ئێستا دڵەکانتان هۆگر و تەبا بوون و ئیتر بوونە برای یەکتر کەچی دوای ئەمە دەگەڕێنەوە بۆ جاهیلیەت و دەتانەوێت بجەنگن لەگەڵ یەکتر هەروەك دەجەنگان لە جاهیلیەتدا کە یەکێکتان خوێنی ئەوی تری حەلاڵ دەکرد جا دەروازەی کوفرەکە لێرەدایە (يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ).

دێینە لای ئەم ئایەتە بەوەی پەیوەندی چییە بە واقیعی ئێمە؟ کە ئەمەیە دەمەوێت باسی لێوە بکەم، کاتێك توێژینەوە دەکەیت لەم ئایەتە وا هەست دەکەیت کە دابەزیوە لەم ڕۆژگارەی ئێمە، چۆن؟ الله تعالى خاوەن ئیمانەکان دەدوێنێت (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟)، یەکێك لە زانایانی تابیعین کاتێك (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ

(١) آل عمران: ١٠٣.

ءَامَنُوٓاْ)ـی دەخوێندەوە دەیوت: پەروەردگارم قسەی لەگەڵم کرد، وە (عبد الله بن مسعود ﴿رضي الله عنه﴾) دەڵێت: کاتێك الله فەرمووی (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ) ئەوە گوێبگرە چونکە یان فەرمان دەکات بە چاکەیەك یان ڕێگری دەکات لە خراپەیەك، (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ) سەرەتا؛ کێن ئەوانەی پەڕتوکی ئاسمانیان پێدراوە؟ بریتیین لە جوولەکە و نەساڕا، ئەوانەش لە دینی ئێمەدا بە خاوەن پەڕتوك (أهل الكتاب) هەژمار دەکرێن ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾[١]، واتە: خواردنی ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانییان پێدراوە بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان، ئافرەتانی داوێن پاك لە ئیمانداران و ئافرەتانی داوێن پاك لەوانەی کتێبیان پێدراوە پێش ئێوە (بۆتان حەڵاڵە). کەوابوو ئەوانە بە خاوەن پەڕتوك لە قەڵەم دەدرێن کە ئەمەش تەشریعی پەروەردگارمانە، وەك زانراوە الله عز وجل کاتێك ناوی ناون بە (أهل كتاب) کە کافرن هەروەك دەزانیت، وە خواردنی ئەوان و مارەکردنی ئافرەتانی ئەوانی حەڵاڵ کردووە بۆمان ئەوا هەر لە قورئاندا فەرموویەتی ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ﴾[٢]، کەوایە ئێستا زانیم (إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ) بریتیین لە جوولەکە یان نەساڕا، ئەوەی کە ڕوویداوە ئەوەیە ئەمریکا هاتە نێو وڵاتەکەمان، هاتە نێو عێراق، ئەوانە خاوەن پەڕتوکن هەر چۆنێك بێت؛ دیموکراسیین، موشریکن، باوەڕیان بە سێ خوا هەیە بەڵام هەر بە خاوەن پەڕتوکی ئاسمانی هەژمار دەکرێن، ئەو ئەمریکیانە خاوەن پەڕتوکن بەڵام نەك هەموو نەسڕانییەکان بەڵکو دەستەیەکن لەوانەی خاوەن پەڕتوکن، واتە هەموو نەسڕانییەکان نەهاتونەتە نێو وڵاتەکەمان بەڵکو دەستەیەك لە خاوەن پەڕتوکەکان هاتونەتە نێو وڵاتەکەمانەوە، بۆیە ئەم بەشە لە ئایەتەکەدا هاتوەتە دی لەوەی ڕوویدا پێش ساڵانێك لەمەوبەر لە وڵاتەکەمان، دوای ئەمە الله تعالى فەرمووی (إِن تُطِيعُواْ) واتە ئەگەر گوێڕایەڵی ئەم دەستەیەتان کرد لە خاوەن پەڕتوکەکان (يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ {يا مؤمنين} كَٰفِرِينَ) ئەوا ئەی ئیماندارەکان دوای ئەوە دەتانگێڕنەوە سەر ڕێبازی کوفر و بێباوەڕی، هەروەك دەزانیت کە گوێڕایەڵیکردن تەنها بۆ فەرمانێکە یان ڕێگرییێك، کاتێك لایەنێك فەرمان دەکات بە لایەنێکی تر و لایەنی دووەم کە وەڵامی ئەم فەرمانە دەداتەوە ئەوە پێی دەوترێت گوێڕایەڵیکردن، بە هەمان شێوە ئەگەر لایەنێك نەهی و ڕێگری کرد و لایەنی دووەمیش وەڵامی دایەوە ئەمەش گوێڕایەڵییە، بۆیە وا تێدەگەم لە (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ

(١) المائدة: ٥.

(٢) المائدة: ٧٣.

فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ) کە ئەم دەستەیە بانگەواز دەکەن بۆ شتێك، ئایا ئەم بەشە ڕوویدا لە وڵاتی ئێمە؟ بەڵێ ڕوویدا، دوای ئەوەی ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان هاتە نێو وڵاتەکەمان ئەوا دەستیان کرد بە بانگکردنی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بۆ دیموکراسی، و بۆ حکومەتێکی تاغوتی و بۆ دەستور و..، بانگەشەیان کرد بۆ هەموو ئەو شتانە لە وڵاتەکەمان، کەوایە ئەم دەستەیە لە خاوەن پەرتوکەکان هاتنە ناویەوە و بانگەوازیان کرد بۆ کوفر، بەدڵنیاییەوەش گەیشتینە پوختەیەك کاتێك باسی دیموکراسییمان کرد بە پێناسە و کۆڵەکەکانیەوە زانیمان کە دیموکراسی دینێکی کوفرییە، ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان بانگەوازیان کرد بۆ دیموکراسی، بانگەوازیان کرد بۆ حکومەتێکی تاغوتی، بانگەوازیان کرد بۆ دەستور و بانگەوازیان کرد بۆ پەرلەمان و بانگەوازیان کرد بۆ هەر یەك لەمانە، کەواتە ئەم دەستەیە هات و بانگەوازیشی کرد ئێستا دەوەستین لە (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ) ئایا حاڵی ئەو خەڵکە چیبوو لە بەرامبەر بانگەوازی ئەم دەستەیەی خاوەن پەڕتوکەکان؟ وە قسەم دەربارەی ئەوەیە کە ئەوان پێی دەڵێن "سێگۆشەی سوننی" واتە ڕافیضە لە چوارچێوەی قسەکانم نین، ئەوانە لە دەرەوەی کەوانەن چونکە مسوڵمان نین، تەنها قسە دەکەین دەربارەی سێگۆشەی سوننی، ئەم دەستەیە کاتێك هات و بانگەوازی کرد بۆ دیموکراسی و بۆ پەرلەمان و بۆ دەستور و بۆ قانون و بۆ..، ئەو خەڵکە گوێڕایەڵییان چۆن بوو بۆ ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان، خەڵك لەو ناوچانەدا دابەش بوون بۆ سێ بەش، بەشی یەکەم: هاوڕێیانی حیزبەکان بوون؛ حیزبی عێراقی و حیزبی فلانی و ... هەموو ئەو حیزبانەی لە سێگۆشەی سوننی هەبوون و لەگەڵ هاتنی ئەمریکا پەیدا بوون ئەوا وەڵامی بانگەوازی ئەم دەستەیەیان دایەوە لە خاوەن پەڕتوکەکان، ئەم دەستەیە وتی: دیموکراسی ئەوانیش وتیان: دیموکراسی، پەرلەمان.. پەرلەمان، حکومەتی تاغوتی.. حکومەتی تاغوتی، قانون و دەستور.. وتیان لیژنەیەکی نووسینەوەی دەستور پێکدەهێنین و بە جگە لە قانون و جگە لە دەستوریش ڕازی نابین، جا ئەو حیزبانە ئەم چینەی یەکەم گوێڕایەڵی ئەم دەستەیەیان کرد لە خاوەن پەڕتوکەکان لە بانگەوازیان بۆ کوفر، ڕاجیاین لەم بابەتە؟ ڕاجیا نین ئەمە واقیعە، باشە، بەشی دووەم لە خەڵکی لە سێگۆشەی سوننی حاڵیان ئەوە بوو کە سەر بە حیزبەکان نەبوون؛ هاوکات کە دەڵێم حیزب مەبەستم تەنها سەرانیان نیە بەڵکو هەموو ئەندام و لایەنگرێکی ئەم حیزبە گوێڕایەڵی ئەم دەستەیەیان لە خاوەن پەڕتوکەکان کرد لە بانگەوازیان بۆ کوفر بەوەی بەدەم بانگەوازەکەیانەوە هاتن، هەموو لایەنگرێکی حیزبەکە، بەڵام چینی دووەم کە خۆیان نەداوەتە پاڵ ئەو حیزبانە بەڵام ڕازی بوون بە کاری ئەو حیزبانە ئەوانەش بە هەمان شێوە لە چوارچێوەی حوکمی ئەو حیزبەن چونکە ڕازیبوون بە کوفر کوفرە -هەروەك دەزانیت-، چینی سێیەم هەیە: کەسانێکن حاڵیان وەك حاڵی عەوامی مسوڵمانانە، تیایاندایە ئیماندارێکی دانیشتووە [لە جیهاد]،

وە هەیانە پەیوەندی بە هیچ شتێکەوە نیە و تیایاندایە موڕتەدە و ئیتر شتانێکی زۆری تر کە هەن لەناویاندا بەڵام پەسەندی حیزبەکانیان نەکردووە و پەسەندی خاوەن پەڕتوکەکانیان نەکردووە و پەسەندی موجاهیدانیشیان نەکردووە، کەسانێکن سەرقاڵن بە ژیانی دونیایان و ئەم جۆرە شتانە، ئەمەش چینێك بوون، چینێکی تر هەیە: ئەوانەن کە زانیان لە دینەکەیان ئەگەر کافر بێتە نێو وڵاتانی مسوڵمانان ئەوا جیهاد دەبێتە فەڕزی عەیین بۆیە چەکیان هەڵگرت و دەستیان کرد بە جەنگ گێڕان، ئەوانەش بە هەمان شێوە چینێکن، وە ڕەتیان کردەوە حوکم بکرێت بە دیموکراسی یان بە قانون یان بە دەستور یان بە پەرلەمان یان بە حکومەتی تاغوتی، ئینجا جەنگان و بەرەنگاربوونەوە تاوەکو الله عز وجل دەسەڵاتداری کردن و شکستی هێنا بە سوپای ئەمریکی -مارێنز- لەسەر دەستیان، ئەم چینی چوارەمە کە موجاهیدانن هەندێك برایان هەبوون سەریاندەخستن -هەندێك لە برایان لەم وتارەدا ئەم چینەیان بیرخستمەوە- جا ئەوانە موجاهید نەبوون، ئیمانداری دانیشتوو بوون بەڵام موجاهیدانیان سەردەخست لە ڕووی لەخۆگرتن و لە ڕووی دابین کردن و لە ڕووی شتانێکی تر، ئەوانە پاداشتی لەخۆگرتنیان بۆ هەیە بەڵام لەخۆگرتن و ئەو خزمەتانەی پێشکەشیان دەکرد حوکمی جیهاد لەسەریان لانابات چونکە جیهاد فەڕزی عەینە لەسەر هەموو مسوڵمانێك، بەڵام ئەوان پاداشتی خۆیان بۆ هەیە لەوەی بەهۆیەوە هاوکاری برایانیان کرد بە درێژایی ئەو ماوەیە -الله تعالی پاداشتییان بداتەوە-، ئێمە دەماینەوە لە ماڵەکانیان و کەمتەرخەمییان نەکرد لەگەڵ براکانیان لە هیچ شتێکدا -الله تعالی پاداشتیان بداتەوە-، جا چینەکان بەم شێوەیە بوون دوای ئەوەی ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان هاتە نێو وڵاتەکەمان و ئینجا دەستیان کرد بە بانگەواز کردن بۆ کوفر، دوای ئەوەی ئەو خەڵکانە بەدەم بانگەوازی ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان هاتن بۆ دیموکراسی و پەرلەمان و دەستور و قانون و هاوشێوەی ئەمانە، الله تعالی دەفەرموێت (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ) بەدڵنیاییەوە ئەم کوفرەی مەبەستە لێرەدا و بەپێی واقیعی ئێمەش ئەمە کوفری لە دین دەرچوێنەرە لەبەرئەوەی دەستەکە لە خاوەن پەڕتوکەکان بانگەوازیان کرد بۆ کوفر بەو وشە و زاراوانەی باسم کرد؛ دیموکراسی و دەستور و پەرلەمان و ئەم جۆرە شتانە، ئەو خەڵکەی وەڵامی ئەم دەستەیەیان دایەوە ئەوا هەڵگەڕانەوە دوای باوەڕهێنانیان و کافربوون، ئەمە لەو شتانەیە ناکۆك و ڕاجیایی تیادا نیە بەگوێرەی ئەو وتارانەی پێشکەشمان کرد لە سەرەتای خولەکە تا ئەم ڕۆژەی ئێستامان، کاتێك قسەمان کرد دەربارەی شیرکی گوێڕایەڵیکردن و لیژنەی نووسینەوەی دەستور و دەستور و قسەمان کرد دەربارەی جێبەجێکەرانی دەستور، هەموو ئەو قسانە پەیوەست دەبێت بەوەی ئێستا دەیڵێم سەرسوڕمانییەکە لە کوێدایە؟ الله تعالی دەفەرموێت (وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ

﴿رَسُولُهُۥ﴾ واتە چۆن گوێڕایەڵی ئەم دەستەیەی خاوەن پەڕتوکەکانتان کرد، وە کوفرتان کرد بەهۆی گوێڕایەڵیکردنتان سەرەڕای ئەوەی پەڕتوکی الله عز وجل لەبەردەستتانە و ئایەتەکان هەن و فەرموودەکانیش بە هەمان شێوە هەن جا چۆن ڕووتان وەرگێڕا لەو ئایەتانە و لەو فەرموودانە کە دەتانپارێزێت لە کەوتنە نێو کوفر و ڕیدە ئیتر چۆن گوێڕایەڵی ئەو دەستەیەتان کرد لە خاوەن پەڕتوکەکان؟! (وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ) ئاماژە دەکەم بە هەندێك ئایەت لەوەی بیرمە و دەتوانیت بگەڕێیتەوە سەر ئایەتەکانی تر، (وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ) ئایا دەزانی چۆن الله عز وجل وەسفی ئەو خاوەن پەڕتوکانەی کردووە؟ -سەرنج بدە- لە کۆتایی ئایەتێك لە سورەتی (النساء) الله تعالى دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمۡ عَدُوّٗا مُّبِينٗا﴾[1]، واتە: بەڕاستی کافران دوژمنانی ئاشکرای ئێوەن. (وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ) هەموو کافرێك دوژمنە، بەڵام الله عز وجل بە تایبەت باسی نەساڕای کردووە دەفەرموێت (لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ) وە هۆکاری باسکردنم بۆ ئەم ئایەتە ئەوەیە چونکە ئەو دەستەیەی هاتن ئەوا لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەر عیسا هەژمار دەکرێن -درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت- (لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ) کەوایە ئەم دەستەیەی هاتە نێو وڵاتەکەمان و بانگەوازی کرد بۆ کوفرکردن بە الله عز وجل و خەڵکیش وەڵامیان دانەوە، الله عز وجل دەربارەیان دەفەرموێت ئەوان دوژمنی ئێوەن (إِنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمۡ عَدُوّٗا مُّبِينٗا) لە پێشەکی ئەو دوژمنانەش کێن؟ (لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ) وە لە چوارچێوەی ئەو دوژمنانەش، فەرموودەی الله تعالى ﴿۞لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ﴾[2]، واتە: بێگومان دەبینیت و دەستت دەکەوێت سەر سەختترینی خەڵك لە دوژمنایەتیدا بەرامبەر بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، جوولەکەن و ئەوانەشی کە هاوەڵیان بۆ الله داناوە. (وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ) واتە ئەم زانیارییە؛ چەسپاندنی دوژمنایەتی ئەوانە بەپێی هەواڵگری ئینسانی نیە، واتە فڵانە کەس نەهاتوەتە لات و بڵێت ئەی شێخ وریابە لەوانە، وای دەبینم ئەوانە دوژمنایەتیمان دەکەن، ئەمە هەواڵێکی ئینسانییە بەڵام ئەوەی هاتووە بۆمان لە پەڕتوکی پەروەردگارمان ئەمە وەحییە لە الله عز وجل، جا کە دوژمنایەتی نەساڕای بۆمان جێگیرکرد ئیتر دوای ئەوە ناکرێت کەسێك بێت و بڵێت: ئەوانە دۆستمانن و چاکەیان بۆمان دەوێت و دەیانەوێت وڵاتەکەمان ئاوەدان بکەنەوە و دەیانەوێت بچینە پاڵ شارستانیەت

(١) النساء: ١٠١.

(٢) المائدة: ٨٢.

و دەیانەوێت پێشبکەوین، ئەم قسانە ناکاتە هیچ چونکە سۆز و دۆستایەتی و خۆشەویستیت چەسپاند لە کاتێکدا الله عز وجل پێچەوانەی ئەمەی چەسپاندووە کاتێك فەرمووی (إِنَّ ٱلْكَـٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا )، کەواتە (وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ) دوای ئەمە، دوای ئەوەی چەسپاندت ئەوانە دوژمنن، گوێڕایەڵیکردنیان دەرچوێنەرە لە دین (إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ) بۆی چەسپاندیت کە دوژمنە، فەرموویشی ئەگەر گوێڕایەڵیت کرد ئەوا دەردەچیت لە دین، ئەمانە ئایەتانێکن دەخوێنرێنەوە ئیتر چۆن گوێڕایەڵی دەکەیت؟ دوای ئەمە؛ ئەم گوێڕایەڵیکردنە خەڵکی برد بەرەو سەرپێچی کردنی الله عز وجل، کارەکە گەیشتە ئەوەی کە الله تعالی هیچ فەرمانێك و قەدەغەکردنێکی بۆ نەمێنێتەوە لەسەر هیچ یەکێك لە بەندەکانی لە زەوی، لەم سێگۆشەیەدا فەرمانەکانی الله عز وجل هەڵوەشێنراوەتەوە، جا کەوابوو چۆن گوێڕایەڵییان دەکەیت؟ ماددەی ٣٥ -دووەم- لە دەستوری عێراقی دەڵێت: "دەوڵەت پاراستنی تاکەکان لەئەستۆی خۆی دەگرێت لە زۆرلێکردنی فیکری و سیاسی و دینی" واتە بەگوێرەی ئەم قانونە کە بەهۆیەوە گوێڕایەڵی ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان دەکەن، ناتوانیت زۆر بکەیت لە هیچ کەسێك لەسەر نوێژکردن، لە کاتێکدا الله تعالی بۆ هیچ مەبەستێك دروستی نەکردووین جگە لە پەرستنی خۆی نەبێت﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾[١] ، تەنانەت ئەم مەبەست و ئامانجە کە لە پێناویدا دروستکراوین پەکخراوە، ناتوانیت هیچ شتێك بڵێی، بۆچی؟ چونکە ئازادی بیروباوەڕ هەیە و ئازادی ڕادەربڕین هەیە و ماددەی ٣٥ لە دەستوری عێراقی هەیە کە دەڵێت: "دەوڵەت پاراستنی تاکەکان لەئەستۆی خۆی دەگرێت لە زۆرلێکردنی فیکری و سیاسی و دینی"، ناتوانیت زۆر لە هیچ یەکێك بکەیت لەسەر ئەوەی پابەند ببێت بە پەرستنی الله تعالی کەواتە (وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ) فەرموودەکانی رسول الله (وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ) مەگەر نەگەڕاویت لە فەرموودەکانی رسول الله(ﷺ)تاکو بزانی چی داواکراوە لێت لە بەرامبەر ئەوانە کە هاتوونەتە نێو وڵاتەکەمانەوە و دەستەیەکیشن لە خاوەن پەڕتوکەکان، ئەوا بەسە بۆت هەڵوەستە بکەیت لەسەر فەرموودەی رسول الله (ﷺ): "أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ، ويقيموا الصلاة ، ويؤتوا الزكاة ، فإذا فعلوا ذلك ، عصموا مني دماءهم وأموالهم ، إلا بحق الإسلام ، وحسابهم على الله"[٢] ، واتە: فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵك تاوەکو شایەدی دەدەن هیچ خوایەك نیە بە حەق جگە لە الله و محمد ـیش پێغەمبەری الله ـیە و نوێژ بکەن و زەکات بدەن جا

(١) الذاريات: ٥٦.
(٢) متفق عليه.

ئەگەر ئەمانەیان کرد ئەوا خوێنیان و ماڵ و سامانیان لێم حەڕام دەبێت تەنها بە مافی ئیسلام نەبێت، وە لێپرسینەوەشیان لەسەر الله ـیە. هەروەها لەمەدا ئەمەت بەسە ئەو فەرموودەیەی ئیمامی موسلیم -رحمه الله- گێڕاویەتیەوە لە (أبي هريرة ـەوە ﵁) وتویەتی: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: "والذي نفس محمد بيده ، لا يسمع بي أحد من هذه الأمة يهودي ولا نصراني ثم يموت ولم يؤمن بالذي أرسلت به إلا كان من أصحاب النار" رواه مسلم، واتە: سوێند بەوەی گیانی محمد ـی بەدەستە، هیچ یەکێك نیە لەم ئوممەتەدا کە جوولەکە بێت یان نەسڕانی پاشانیش بمرێت و باوەڕی بەو پەیامە نەهێنابێت کە پێی نێردراوم ئیللا لە هاوەڵانی ئاگرە. مەگەر ئەم فەرموودانەت بەس نیە؟! مەگەر ئەو فەرموودەیەت بەس نیە کە لە لای (الطبراني -رحمه الله-) هاتووە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺفەرموویەتی: "بعثت بالسيف بين يدي الساعة حتى يعبد الله تعالى وحده لا شريك له ، وجعل رزقي تحت ظل رمحي ، وجعل الذل والصغار على من خالف أمري"، واتە: نێردراوم بە شمشێر لە نزیك قیامەت بۆ ئەوەی الله تعالی بە تاك و تەنها بپەرسترێت و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدرێت، وە ڕزقیشم بۆ کراوەتە ژێر سێبەری نێزەکەمەوە، وە ڕیسوایی و زەلیلی خراوەتە سەر هەر کەسێك کە پێچەوانەم بکات و لەم ڕێگایە لابدات. کەوایە (**وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ**) ئەگەر دەتەوێت توێژینەوەیەکی فراوان بکەیت دەربارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ چی فەرمووە جگە لەم فەرموودانە ئەوا بڕێکی زۆرت دەست دەکەوێت، وە ئەگەر دەتەوێت توێژینەوەیەکی فراوان بکەیت لەبارەی ئایەتی تر ئەوا بڕێکی زۆرت دەست دەکەوێت جا سەیروسەمەرەکە لە کوێدایە؟ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە چۆن وەڵام دەدەنەوە بۆ ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان و چۆن گوێڕایەڵییان دەکەن! وە بەهۆی ئەم گوێڕایەڵیکردنەوە دەرچوون لە دین و بوون بە کافر-پەنا بە الله- لە کاتێکدا ئایەتەکانی الله و فەرموودەکانی رسول الله ﷺلەبەردەستیانە، [قوتابیەك داوای دووبارەکردنەوەی فەرموودەیەکیان دەکات] "بعثت بالسيف بين يدي الساعة حتى يعبد الله تعالى وحده لا شريك له ، وجعل رزقي تحت ظل رمحي ، وجعل الذل والصغار على من خالف أمري"، بیرم چوو باسی فەرموودەیەك بکەم سەبارەت بەوانە ئەوانەی سەر بە حیزبەکان نین کە هەڵگەڕاونەتەوە لە دینی الله عز وجل، بەڵام ڕازیبوونە بە کارەکانی ئەو حیزبە، فەرموودەیەك کە ئیمامی (الترمذي -رحمه الله-) باسی کردووە و بە صەحیحی داناوە، لە دایکی سەلەمە وە ﵁دەڵێت: پێغەمبەر ﷺفەرموویەتی: "يكون عليكم أمراء تعرفون وتنكرون {يعني تكون عندهم مخالفات، هم أمراء يحكمون بما أنزل الله، تكون فيهم بعض المخالفات تعرفون هذه المخالفات وتنكرون} فمن أنكر فقد برئ ، ومن كره فقد سلم ولكن من رضي وتابع"، واتە: لە ئایندەدا کاربەدەست و دەسەڵاتدارانێك حوکمتان دەکەن ئێوە دەزانن و نکوڵیشی لێدەکەن {واتە هەندێك سەرپێچی کردنی شەرعیان هەیە، ئەوان

دەسەڵاتدارن حوکم دەکەن بەوەی الله دایبەزاندووە، هەندێك سەرپێچییان هەیە ئێوەش ئەم سەرپێچیانە دەزانن و نکوڵی لێدەکەن} جا ئەوەی نکوڵی بکات ئەوا بێتاوانە و بەرییە، وە ئەوەی پێی ناخۆش بێت ئەوا سەلامەت بووە بەڵام ئەوەی ڕازی دەبێت و شوێنی دەکەوێت [بەشدارە لەگەڵیان]. کەوایە دەشێت سەر بە حیزبەکە نەبێت بەڵام ڕازیبووە بەم حیزبە ئەوا ئەم فەرموودەیەی لەسەر جێبەجێ دەبێت، بە هەمان شێوە لە فەرموودەکەدا هاتووە وتیان: ئایا دژیان نەجەنگین ئەی رسول الله ؟ فەرمووی: نەخێر مادام نوێژ بکەن، هەتاوەکو نوێژ بکەن هەرچەندە ئەو سەرپێچیانەشیان لێببینن ئەوا لێیان دەرمەچن، ئەمە لەبارەی پیاوێك کە حوکم دەکات بەوەی الله دایبەزاندووە ئەی چی بگات بەوانە کە ڕازی بووە پێیان و شوێنیان کەوتووە -پەنا بە الله- ، ڕزگاربوون لە کوێدایە؟ مسوڵمانان چۆن ڕزگاریان دەبێت لە چڕنوکەکانی ئەم دەستەیە و لە شوێنکەوتووانی ئەم دەستەیە لە حیزبەکان -پەنا بە الله- ؟ فەرمووی **(وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ)** وە مانای (الإعتصام بالله) واتە دەستگرتن بە پەڕتوکی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی، بەوەی خۆت فێری دینی الله تعالی بکەیت بەڵام نەك لە بیرمەندەکانی ئیخوان و نە لە زانایانی مورجیئەی کەناڵەکان؛ ئەو خۆشەویستانەی تاغوتان، بەڵکو بگەڕێیتەوە بۆ لای زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە، بگەڕێیتەوە بۆ لای زانایە بەڕێزەکانمان -رحمهم الله- لە دینەکەت تێبگەیت لە ڕێگەی ئەوانەوە، جا ئەگەر دینەکەت فێر بوویت لە ڕێی ئەوانەوە ئەو کاتە ناکرێت سەرپێچی ئەوە بکەیت کە لە دینەکەت فێر بوویت، وە شوێنی دەستەیەك لە خاوەن پەڕتوکەکان بکەویت یاخود شوێنی کەسانێك بکەویت کە ڕازیبوونە گوێڕایەڵی ئەم دەستەیە بکەن لە خاوەن پەڕتوکەکان، کەوابوو دەستگرتن بە پەڕتوکی الله عز وجل بە زانست و کردارەوە ئەوە ڕزگارت دەکات لە گوێڕایەڵی کردنی ئەم دەستەیە لە خاوەن پەڕتوکەکان لە هەر کوێیەك بن، ئەمە ئایەتی یەکەم، ئایا وای نابینی هەروەك ئەوە وایە ئێستا لەسەرمان دابەزیبێت؟ ، ئایەتی دووەم: الله تعالی دەفەرموێت ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾﴾[1] ئەم ئایەتە پەیوەندی هەیە بە ئایەتێکی تر، ئەم ئایەتە لە سوڕەتی (النساء) بەڵام ئایەتی دووەم لە سوڕەتی (الأنعام)ـە: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ﴾[2] ، واتە: کاتێکیش ئەوانەت بینی کە دەم لە ئایەتەکانی ئێمەوە دەدەن و (دەیکەنە

(١) النساء: ١٤٠.

(٢) الأنعام:٦٨-٦٩.

گاڵتەجاری خۆیان) ئەوە تۆ پشتیان تێ بکە و کۆڕ و کۆبوونەوەیان بەجێ بهێڵە هەتا ئەو کاتەی دەچنە ناو باسێکی ترەوە، کاتێکیش ئەگەر شەیتان لە بیری بردیتەوە (کە دوور بکەویتەوە لێیان) جا دوای ئەوەی کە بیرت هاتەوە لەگەڵ قەومی ستەمکاران دامەنیشە * (هەرچەندە) تاوانی نەفامان هیچ کار ناکاتە سەر پاداشتی ئەوانەی خواناس و دیندارن. پەیوەندی ئەم ئایەتە چییە بە ئایەتی دووەم؛ ئایەتی یەکەم (إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ) کە ئەمە بەشێکە لە ئایەتەکە، ئایا پەیوەندی چییە بە فەرموودەی الله عز وجل (وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ) ؟ واتە ئەگەر تۆ دانیشتیت لە دانیشتگایەك و بەشداریت لەگەڵیان نەکرد مانای ئەوەیە تۆ لێپرسینەوەت لەگەڵ ناکرێت لەسەر ئەوەی لەوان دەردەچێت، سەرەتا چۆن تێبگەین لەم بەشە لە ئایەتەکەدا (وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ) واتە کەسانێك بە خراپ دوان لەبارەی ئایەتەکانی الله و گاڵتەیان کرد، تۆ ئەگەر خۆت بپارێزیت و لە الله بترسیت ئەوا لێپرسینەوەت لەگەڵ ناکرێت لەسەر ئەوەی ئەوان دەیکەن، جا ئەم بەشەی ئایەتەکە (وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ) وەك ئەوەی الله تعالى سەرپشکت بکات لە نێوان ئەوەی دابنیشیت یان دانەنیشیت، ئیمامی (الشنقيطي -رحمه الله-) لە تەفسیرەکەی دەڵێت -کە بە ماناوە دەیگوازمەوە نەك بە دەق- دەڵێت: مانای (وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ) ئەوەیە ئەگەر کەسانێك دانیشتن ئینجا کوفریان دەکرد بە ئایەتەکانی الله و گاڵتەیان دەکرد، تۆش دانەنیشتی لەگەڵیان ئەوا الله عز وجل لێپرسینەوەت لەگەڵ ناکات لەسەر ئەوەی ئەوان دەیکەن لەبەرئەوەی خۆت پاراست لە دانیشتن لە نموونەی ئەم دانیشتگایانە، ئەمە تەفسیری یەکەم بۆ ئایەتەکە؛ واتە بەوەی خۆت بەدوور بگریت لەم دانیشتگایانە، سەبارەت بە تەفسیری دووەم: ئەوەی کاتێك بە خراپ بدوێن و گاڵتە بکەن بە ئایەتەکانی الله و کەسەکەش لەگەڵیان دانیشتبێت، جا ئەمە چۆن دەبێت (وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ) دەڵێت: لەگەڵیان دادەنیشێت بەڵام بەشداریان لەگەڵدا ناکات نە لە کوفرکردن و نە لە گاڵتەکردنەکە پاشان دەڵێت جا ئەمە لە ڕۆژگاری تەقییە بوو، ڕوونە ان شاء الله، زانایان وتویانە: فەرموودەی الله تعالى (وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ) دەڵێن ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە فەرموودەی الله تعالى (إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ) ئەوانەی نەسخەکەیان گواستوەتەوە؛ موجاهید و ئیبن جورەیج و سوددی، هەروەك (ابن كثير -رحمه الله-) دەیگوازێتەوە لەوان، هەروەها ئیمامی شەوکانی بە هەمان شێوە نەسخەکەی گواستوەتەوە و هەروەها نەحاس -رحمه الله- لە پەڕتوکەکەیدا (الناسخ والمنسوخ) چەسپاندوویەتی ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتەکەی تر، هەروەها ئیمامی (الشنقيطي -رحمه الله-) ئەمەی باسکردووە، کەوابوو ئایەتی سەرپشکردن (وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ) ئەمە

نەسخ بۆتەوە، کامە ئایەت نەسخی کردۆتەوە؟ فەرموودەی الله تعالی (إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ)، بۆیە بەگوێرەی ئەم نەسخبوونەوەیە دروست نیە بۆ مسولمان لە دانیشتگایەك دابنیشێت تیایدا کوفر بکرێت بە ئایەتەکانی الله عز وجل یان گاڵتەیان پێبگرێت، ڕوونە ان شاء الله، ئەم دانیشتنە ئەگەر دانیشتنی سەرپێچیکردن و تاوان بێت، هەر کەسێك لەگەڵیان دابنیشێت ئەوا بەشداری کردووە لەگەڵیان لە سەرپێچی و گوناهـ، ئەگەریش دانیشتنی کوفر و گاڵتەکردن بێت ئەوا بەشداری لەگەڵیان کردووە لە حوکمی کوفرەکە و لە حوکمی گاڵتەکردنەکە، سەبارەت بە دانیشتنی گوناهـ و تاوان؛ (ابن کثیر -رحمە الله-) لە تەفسیرەکەی باسی کردووە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز -رحمە الله- لە ماوەی خیلافەتەکەیدا کەسانێکیان هێنایە لای ئارەقیان خواردبووەوە جا ئەویش ویستی حەددەکەیان لەسەر جێبەجێ بکات، ئینجا وتیان -واتە بە پێشەوای ئیمانداران عومەری کوڕی عبدالعزیز- وتیان: یەکێکیان بەڕۆژووە، وتی: لەویەوە دەست پێبکەن پاشان وتی: ئایا گوێت لە فەرموودەی الله تعالی نەبووە (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ.. إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ) وتی لەویەوە دەست پێبکە؛ هەرچەندە ئەو ئارەقی نەخواردبووەوە، پیاوەکە بەڕۆژوو بوو بەڵام لەگەڵ کەسانێك دانیشت کە سەرپێچی فەرمانی الله تعالی ـیان کرد بۆیە هەمان حوکمی ئەوانەی وەرگرت کە ئەم خراپەیەیان ئەنجامدا (إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ) کەوایە دانیشتنەکان ئەگەر گوناهـ و تاوانی تیادا بوو ئەوا هەر کەسێك لەگەڵ کەسانی گوناهکار دابنیشێت ئەوە لەوانە، پێویستە یان جێی بهێڵێت یان نکوڵی بکات و ڕەخنەیان لێبگرێت، بەڵام ئەگەر دانیشتنەکە دانیشتنی کوفر و گاڵتەکردن بوو؛ گاڵتەکردن کردارێکی لە دین دەرچوێنەرە بەپێی فەرموودەی الله تعالی ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ﴾[1] ، واتە: (کاتێك تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ)لە گوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت) و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمە و گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە الله و ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان کرد؟! * (ئیتر بێ سوودە) پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو. بۆیە گاڵتەکردن کوفرێکی لە دین دەرچوێنەرە، جا هەر کەسێك لە دانیشتگایەك دابنیشێت کوفر بکرێت بە ئایەتەکانی الله عز وجل و گاڵتە بکرێت ئینجا ئەویش دانیشتگاکە جێنەهێڵێت و دژیش نەوەستێتەوە (إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ) بەڵام جیاوازییەکە لە نێوانیاندا هەر ئەوەیە کە ئەوەی کوفر دەکات و گاڵتە دەکات ئەمە کافرە بەڵام ئەوەی دادەنیشێت و دژیش ناوەستێتەوە و دانیشتگاکەش جێناهێڵێت لە

(١) التوبة: ٦٥ – ٦٦.

کاتێکدا بانگەشەی خۆدانە پاڵ ئیسلام دەکات ئەمە مونافیقە، وە نیفاقەکەی بیروباوەڕییە بە بەڵگەی ئەوەی الله عز وجل حوکمی هەردوو لایانی لە دونیا وەك یەك لێکرد فەرمووی (**إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ** ) تۆ جیاوازییت نیە لەگەڵ ئەم گاڵتەکەرە و جیاوازییت نیە لەو کەسەی کوفری کرد بە ئایەتەکانی الله، وە سزاکەشیان بە هەمان شێوە وەك یەکە لە دواڕۆژدا فەرمووی (**إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا** ) جا حوکمەکەیان لە دونیادا وەك یەکە و سزاکەشیان لە دواڕۆژدا وەك یەکە، جیاوازییەکە لە کوێدایە؟ جیاوازییەکە تەنها لە ناوەکەدایە؛ ئەوەی کوفری کرد و گاڵتەی کرد ئەمە کافرە، ئەوەی دانیشت لەگەڵی و نکوڵی لێنەکرد و جێی نەهێشت ئەمە مونافیقە هەر بۆیە الله عز وجل فەرمووی (**إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ** {واتە ئەوانەی لەگەڵ گاڵتەکەرەکان و کافران دادەنیشن} **وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا** ) بەیانی یاخود ڕۆژی شەممە تەواوی دەکەین ئەگەر الله تعالى بۆی ئاسان کردین.

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**

